بسم الله الرحمن الرحيم

**إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.**

**{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ} .**

**يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً**

**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً} أما بعد**

**وإِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ، وَأَحْسَنَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ، وَشَرُّ الْأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلُّ مُحْدَثَةٍ ببِدْعَةٌ، وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ، وَكُلُّ ضَلَالَةٍ فِي النَّار**

## پێشەکی:

وەکو دەبینین لەناو خەڵکیدا چەندەها شتی جاهیلی بڵاو بونەتەوە وە ئەم جەهالەتانەش ئەوە نەبێت شتێکی تازە بێت لەسەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەبووە وە ئەمانەی سەردەمی ئەمڕۆ دێن نەک هەر مەسەلە جاهیلیەکە زیندوو ئەکەنەوە بەڵکو لەخەڵکی ئەکەن بە عیبادەت و خواپەرستی ،وە ئەمڕۆش چەند کەسانێک هەن بانگێشە بۆ ئەوجەهالەتانە ئەکەن بەداخەوە موسوڵمانان ئەکەونە ئەو جەهالەتەوە چونکە ئاگایان لەقورئان و فەرموودە نییە .

بۆیە بەباشم زانی ئەم کتێبە بنوسم بۆ موسوڵمانان تانەکەونە دوای ئەو جەهالەتەی کە کەسانێک ئەمڕۆ بانگەشەی بۆئەکەن وە موسوڵمانان لەوە تێبگەن کە جەهالەتە وە ئەوانەی ئەوان ئەی کەن بەناوی خواپەرستی و عیبادەت ئەوە نەک پاداشتت نییە لەسەری بەڵکو تاوان بارئەبێت لەسەری ئەگەر بیکەیت

*وە ئەم کتێبە زۆر بەسودە بۆ ئەوکەسانەی کە (**طالب العيلم**)ن ئەتوانن ئەو ئایەت و فەرموودانە لەبەرکەن وەکو چەکێک بەکاری بێنن دژی ئەهلی بیدەع وە ئەکەسانەی کەشوێن ئەو مەسەلە جاهیلانە ئەکەون ، جاهەموو شتێک ڕاستی و دروستی ئەوە تەنیا لەخواوەیە لێی بەزیادبێت و سوپاس هەربۆ ئەوە ، وەهەر هەڵەیەکیشی تێدابوو ئەوە لەمنەوەو لەشەیتانەوەیە خواو پێخەمبەری خوا لێی دوورن .

# گفتوگۆ لەنێوان باوک وکوڕ

من ناوم شکارە لەهەورامان ئەژیم هاوینان لە قوتابخانە دینیەکانی هەورامان وانەی دینی ئەخوێنم ژیانێکی سادە ئەژیم لەگەڵ دایک وباوکم ،بەڵام دوای مردنی باوکم ژیانی من زۆر سەخت بوو بۆیە هاوینان نەم ئەتوانی بەردەوام بم لەسەر وانەی دینی دەستم کرد بەکارکردن بۆئەوەی بژێوی ژیانمان پەیداکەم وە لەگەڵ دایکم ئەژیام ژیانی بێ باوکی زۆر قورسە لەگەڵ ئەوەشدا شەوانە کتێبی دینیم ئەکرِی ئەم خوێندەوە زۆر حەزم بەزانستی شەرعی بوو .

ڕۆژێک لەئیش هاتمەوە خاڵم لەماڵمان بوو زۆر بەگەرمی بەخێرهاتنم کرد ،چوین بۆ نوێژی ئێوارە هاتینەوە نانمان خوارد شەودانیشتین خاڵم وتی کەسێک ئەیەوێت داوای دایکت بکات یەکەم جار ڕازی نەبووم بەڵام زانیم کەئەوە مافی شەرعی دایکە بۆیە وتم خاڵە تۆو باپیرم هەرچی بڵێن لەقسەتان دەرناچم ئەوە بوو دوای یەک هەفتە هاتنە داوای دایکم ،بەڵام من تائێستا نەم زانی بوو ئەو کەسەی ئەبێت بەباوە پیارەم کێیە،کاتێک هاتەژورەوە کەسێکی ڕیش پڕبوو باڵایەکی بەرزی هەبوو کەسێکی جوانبوو ،دوای ئەوەی کەدانیشتن داوای دایکمیان کرد ئەوە بوو کەدایکمیان پێدا،دوای ماوەیەک دایکمی گواستەوە ،من هەربەناوی کاک دارا بانگم ئەکرد قەد پێم نەئەوت باوکە ،بەڵام چی کەسێک بوو کەسێکی زۆرباش ،پاش ئەوەی دایکمی گواستەوە ماڵمان هات بۆ سلێمانی ژیانی ئێرە زۆر جیابوو دەستمکردەوە بەخوێندن لە پۆلی دەی ئامادەی بووم بەڵام ئارەزووی کتێبە شەرعیەکانم هەبوو ،ئەوکەسەی کە ئێستا باوەپیارەمە کەسێکە لەدیندا زۆر شارەزایە شەوانە دوای ئەوەی وانەکانی

قوتابخانەم تەواو ئەکرد ئەچووم بۆلای تاقسەم بۆبکات لەسەردین ،بەلاّم شتێک زۆر بەلامەوە سەیربوو قسەکانی ئەم زۆر جیابوو لەقسەکانی مامۆستاکەی هەورامان ئەمە زۆر سەرنجی ڕاکێشام بەلاّم شەرمم ئەکرد موناقەشەی لەگەلّ کەم چونکە من کەسێکی زۆر شەرمن بووم بەس گوێم بۆ ئەگرت ئەویش پرسیاری نە ئەکرد وەباسی هیچ کەسوو لایەنێکی نەئەکرد تەنها باسی ژیانی هاوەلاّن و قسەی لەسەردین بوو.

مەکتەبەیەکی هەبوو لەمالّ باوکی بوو ڕۆژێک وتی حەزئەکەیت بچین ئەوکتێبانە بهێنین بۆمالّ خۆمان ،منیش وتم باشە ،ڕۆشتین تەلەفونی لەگەلّ کەسێکا ئەکرد باسی سەیارەی دەبلّیان ئەکرد نەم ئەزانی مەوزوع چییە کاتێک گەشتینە ئەوێ دەستی دایک و باوکی ماچ کرد وتی وەرە ژوورەوە کاتێک چوومە ژوورەوە چیم بینی !!! یەک مەکتەبەی گەورە کتێب کەبەس لای ڕاستی بەقەد ئەوشوێنە کتێبی تێدابوو کەمن وانەم لێی ئەخوێند لەهەورامان پێی وتم ئەکتێبانە داگرە یەک یەک دامان ئەگرتوو ئەمان پێچایەوە بۆناو سەیارەکە ئەوەبوو ئەو ڕۆژە زۆر خۆش بوو لەژیانما کەگەشتینەوە مالّەوە کتێبەکانمان یەک یەک ریزکردەوە نزیکی تادرەنگانی شەومان پێچوو ،ئەو شەوە زۆر هیلاک بووم چوومەناو جێگا یەک سەر خەوتم بەلاّم هەربیرم لای ئەو کتێبانەبوو حەزم ئەکرد بیان خوێنمەوە بەلاّم من عەرەبی نازانم .

بەیانی هەلّسام چووم بۆقوتابخانە،کەلەگەلّیا کرامەوە قسەی خۆش و سوعبەتمان ئەکرد وتم ئیتر کاتی ئەوەیە موناقەشەی لەگەلّدا بکەم .

**شەوێکیان چووم بۆلای دام لە دەرگاکەی وتم ئەتوانم لەکاتت بگرم وتی فەرمووو کوڕم .**

**وتم هەندێک شت هەیە ئەمەوێت بۆم ڕوون بکەیتەوە بە بەڵگە .**

**کتێبێکی بەدەستەوە بوو کتێبەکەی داخست و چاویلکەکەی داکەند وتی شتی چی ؟؟**

**وتم شتی دینی بەس ئەمەوێت بەبەڵگەوە**

**وتی باشە ئەی بە چی بەڵگەیەک ئەتەوێت بۆت رونکەمەوە ؟؟**

**وتم بەبەڵگەی قورئان و فەرمووده بەس سوێندت ئەدەم بەخوا با فەرموودەکان (صحيح) بێت .**

**پێکەنی وتی باشە ، وتم ئەمشەو کارت نییە وتی نەخێر وتم باشە ئەم شەو موناقەشە ئەکەین وتی باشە مۆبایلەکەشی کوژاندەوە بۆ ئەوەی تەلەفوونی بۆنەیەت .**

**بە دایکمی وت من و کوڕەکەم قسە ئەکەین میوە مان بۆبهێنە دەستمان کرد بەقسەکردن.**

**وتی فەرمووو قسەبکە .**

**وتم:باشە ، کەسانێک هەن هاوار ئەکەن لە غەیری خوا پیاوچاکان پێغەمبەران(**صلى الله عليه وسلم**)داوایان لێئەکەن شەفاعەتیان بۆبکەن لای خوا وە**

**بۆئەوەی لەخوا نزیک بنەوە نەک ئەوکەسە بپەرستن ، بۆچی هەندێک کەس بەمانە ئەڵێت موشریک ؟ئایا کامیان ڕاستن ؟؟**

**وتی : باشە دواکردن عیبادەتە یان عیبادەت نییە؟؟ تۆ داوا لەخوا ئەکەی لە گوناهت خۆش بێت بۆیە عیبادەتە.**

**وتم: بەڵێ داواکردن عیبادەتە**

**وتی:کوڕی خۆم وتت بەبەڵگە جوابم بەرەوە بۆیە منیش بەبەڵگە جوابت ئەیەمەوە خوای گەورە ئەفەرمویت:**﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ ٣﴾ **﴿الزمر﴾**

**واتە:دەلێن ئێمە ئەولیا و ئەوبت و شتانە ناپەرستین تەنها بۆئەوەی لەخوانزیکمان بکاتەوە ،بێگومان ئەوانە لەخواوە نزیکن،وەخوای گەورە ئەو بیروباوەڕە چەوتەیان لێوەرناگرێت.**

**وتم:کەواتە ئەوانە موشریکن ،وتی بەڵێ ، وتم کەواتە کافرن لەدائیرەی ئیسلام چوونەتە دەرەوە ،وتی : نەخێر ،وتم چۆن موشریکن شیرکیان هەیە کافرنین ،وتی کوڕی خۆم ئەگەر بە نەزانین بێت(جەهل)ئەوە کافر نابن چونکە جەهلیان هەیە بەڵام ئەگەر بۆی ڕوون کرایەوە ئەوە جەهلی نامێنێت ئەگەر بیکات ئەوە تاوان بار ئەبێت و کوفری کردووە .**

**وتم: یانی جەهل ئەبێت بەعوزر بۆی ؟؟ وتی بەڵێ ،وتم ئەوڕۆژە لە ئینتەرنێت مامۆستایەکی ئاینی قسەی ئەکرد ئەی وت جەهل عوزرنییە .**

**وتی کوڕی خۆم بەبەڵگە بۆت ڕون کەمەوە کە جەهل عوزرە، وتم بەڵێ**

**وتی : بە فەرموودەی پێغەمبەر بۆت ڕوون ئەکەمەوە ، تۆزێک فەرموودەکەی بە عەرەبی وت ،وتم بە کوردی بیلێ چونکە من عەرەبی نازانم ،وتی باش**

**وتی یەکەم بەڵگە ئەوکۆمەڵەکەسەی کەلەغەزوە دوای شرکیان لەپێغەمبەر کرد**(صلى الله عليه وسلم) **بەڵام پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **بەکافری دانەنان لەبەر جەهلەکەیان ئەمەش بەبەڵگەی (حديث أبي واقد الليثي).**

**دووەم بەڵگە پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **ئەفەرمووێت:لەئاخیری زەماندا ئیسلام کاڵ ئەبێتەوە وەکو نەخشی جلێک تاوای لێدێت نازانن نوێژ چییە ڕۆژو چییە دەلێن ئێمە باوباپیرانمان دەیان وت (لا الـه إلا اللّه) ئێمەش هەرئەوە دەلێین ،حوزەیفە دەفەرمویت ئایا ئەوە لەئاگرئەیان پارێزێت پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **فەرمووی بەڵێ بەهۆی جەهلەکەیانەوە .**

**سێیەم بەڵگە پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **ئەفەرمووێت: کەسێک لە بەنی ئیسرائیل هیچ کردەوەیەکی چاکی نەبوو بەڵام ئیمان داربوو کاتێک گەشتە سەرەمەرگ بەمنداڵەکانی وت وەسێت ئەکەم بۆئێوە تەرمەکەم بسوتێنن خۆڵەمێشەکەشم بڵاو بکەنەوە بەدەشت و بیابان و بەحردا ،دوای ئەوەی کەکردیان خوای گەورە کۆی کردەوە خۆڵەمێشەکەی، دروستی کردەوە پێی فەرموو تۆ بۆچی ئەم وەسێتەت کرد وتی لەترسی تۆ چونکە لاشەم نەمێنێت عەزابم نادەیت ،بۆیە خوای گەورە لێی خۆش ئەبێت**

زانایان ئەفەرموون بەهۆی جەهلیەوە ئەوکەسە وای زانیوە خوای گەورە ناتوانێت زیندوی کاتەوە بۆیە خوای گەورە بەهۆی جەهلیەوە لێی خۆش بوو.

چوارەم بەڵگە موعاز کاتێک چوو بۆشام بینی خەڵکی شام سوجدە ئەبەن بۆگەورەکانیان ،ئەمیش کاتێک هاتەوە سوجدەی برد بۆ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) وە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) نەی هێشت وتی بۆ وادەکەی ؟؟وتی تۆ لەهەموو گەورەی شام گەورەتری پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی بۆ هیچ کەسێک دروست نییە سوجدە بۆهیچ کەسێک بەرێت .

ئەوەی کە موعاز کردی کوفرە بەڵام پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) کافری نەکرد بەهۆی جەهلە کەیەوە .

منیش وتم کەواتەجەهل عوزرەوەشەرت نییە ئەوەی مامۆستای ئاینی بێت ڕاست بڵێت.

وتی : بەڵێ کوڕی خۆم زۆر جوان تێگەشتی خوا باشترت تێبگەیەنێت .

وتم بەڵام ئەوکەسە بەڵگەی هەبوو کە قسەی ئەکرد .

وتی کوڕم بەڵگەی چی؟ وتم بە دوو فەرموودە بەڵگەی ئەهێنایەوە یەکەم بەڵگەی ئەوەبوو کە دووکەس چوون بۆگوندێک گوندە کەشیرکیان هەبوو فەرمانیان پێکردن مێشێک سەربڕن ئەوەی مێشەکەی سەربڕی ڕاستەو خۆ بۆ دۆزەخە .

وتی کوڕی خۆم ئەو فەرموودەیە (ضعیفە)

**وتم بەڵگەی دووەمی ئەوەبوو پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **کەسێکی بینی شتێکی هەڵواسی بوو بەخۆیەوە پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **فەرمووی ئەوەچییە؟؟**

**وتی نەخۆشم هەڵم واسیوە پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **فەرمووی ئەوە دانێ چونکە نەخۆشیت زیاد ئەکات ئەگەر بەوە بمری کافریت .**

**وتی کوڕی خۆم ئەم فەرموودەیەش هەر وەکو ئەوەی پێشوو ( ضعيفه)** .

**وتم دەستت خۆش بۆ وەڵاّم دانەوەی پرسیارەکە ،وتم باپرسیارێکی کەبکەم**

**وتی فەرموو کوڕم گوێم بۆ گرتووی .**

**وتم کەسانێک هەن چەند حیزبێکیان دروست کردووە بەناوی ئیسلامەوە وە بەناوی وەسیلەی بانگەوازیان،وە چەند کەسێکیش هەن گوێیان پێنایەن وە لەگەڵیشیانین،بەڵاّم چەندکەسانێک هەن نەک هەر لەگەڵیانین بەڵکو ئەوکارەی ئەوان بەحەرام ئەزانن ،ئایا ئەمانەکامیان ڕاستن ؟؟**

**کوڕی خۆم ئەمانەی کەتۆ وتت بابزانین کامیان سودیان پێئەگات لەدونیادا وە کێش خەڵک لێیان ئەڕەنجێت ، بابۆت ڕونبکەمەوە بەبەڵگەی قورئان و فەرموودە .**

**کوڕی خۆم خوای گەورە قەورئاندا ئەفەرموویێت:**﴿ وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ

مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ٣٢

﴾ **الروم**﴾

واتە:مەبن بەو کەسانەی کەشەریک و هاوەڵ بڕیار ئەدەن ،لەوانە کەئاینەکەیان پارچە پارچەکردووە و بوونەتە چەندەها کروپ و دەستە وەهەر گروپێکیش دڵخۆشن بەنەخشەو پلانی خۆیان .

کەواتە ئەگەر ئێمە هەڵسین هەرکەسەو حیزبێک دروستکات چەندکەسێک شوێنی کەویێت ئەوە ئاینەکەمان پارچە پارچەکردووە کە هەمووی بەناوی ئیسلامەوە ئەیکات کە ئەوەی ئەمەبکات وەکو موشریکەکانی کردووە بەگوێرەی ئایەتەکە.

وە لەئایەتێکی تردا خوای گەورە ئەفەرمویێت﴿ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ ﴿١٣﴾ ﴾﴿الشوری﴾

واتە:دەست بگرن بەدینەکەتانەوە تەفرقە مەکەن .

کەواتە ئەو کەسانەی کە حیزب دروست ئەکەن بەناوی دینەوە ئەوانە تەفرەقە دروست ئەکەن چونکە دەبینین هەرکەسەو حیزبەکەی خۆی پێی ڕاستە حەز ئەکات حیزبەکەی خۆی سەرکەویێت و دەسەڵات بگرێت .

وە خوای گەورە لەئایەتێکی تردا ئەفەرموویێت:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ ﴿الانعام﴾

واتە:بەڕاستی ئەوانەی ئاینەکەیان پارچە پارچە کردووە ئەوە لەهیچ شتێکدا لەتۆ نین ،بەڵکو تۆ لەوان بەریت ،بەڕاستی ئەوانە کاروکردەوەیان بۆلای خوایە وە

**تۆڵەی ئەو لادانەیان لێدەسەنێتەوە ،وەلەوەودا هەواڵی هەموو ئەو کارو کردەوانەیان پێ دەدات کە ئەنجامی ئەدەن.**

**کەواتە ئەمە ئایەتێکی ترسێنەرە بۆئەوکەسانەی کەتەفرەقە ئەکەن چونکە ئەو لە پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **نییە وە پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **لەوکەسە بەرییە کەتەفرەقە ئەکات وە خوای گەورە تۆڵەی لادانیان لێئەسەنێت**

**وەخوای گەورە لەئایەتێکی تردا ئەفەرمویت:**﴿وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ ﴿١٠٣﴾ ﴾**﴿ال عمران﴾**

**واتە:هەر هەمووتان بەتوندی دەست بگرن بەئاینی خواوە پەرت و بلاو مەبن (تەفرقەمەکەن)**

**ئەوە ئەمری خوایە بۆئێمە پێویستە دەست بگرین بەدینەکەیەوە وە تەفرەقەو دووبەرەکی نەکەین وە هەرکەسیش بیکات ئەوە ئەمری خوای شکاندووە .**

**وەخوای گەورە لەئایەتێکی تردا ئەفەرمویت:**﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخۡتَلَفُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٥﴾ ﴾**﴿ال عمران﴾**

**واتە:نەکەن وەکو ئەو کەسانەبن کە ناکۆکی و دوو بەرەکی لەناویاندا پەیدابوو لەیکتری دابڕان دوای ئەوەی ئەو هەموو بەڵگەو نیشانە ڕونەیان بۆ هاتبوو بۆ ئائەوانە سزایەکی گەورەی سەخت چاوەڕێیانە .**

**دیسان ئەمە ئایەتێکی ترسێنەرە بۆئەوکەسانەی تەفرەقەئەکەن و هەرکەسە حیزبی خۆی ئەوێت وە با ئەوانە بترسن چونکە سزایەکی سەخت چاوەڕێیانە.**

**وەخوای گەورە لەئایەتێکی تردا ئەفەرمووێت:**﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٥٣﴾ **﴿الأنعام﴾**

**واتە:ئەمە ڕێگای ڕاستی منە کەڕاستە دەئێوەش شوێنی کەون وە شوێن ڕێچکەکانی ترمەکەون چونکە جیاتان ئەکاتەوە لەڕێبازی خوا ئەوەش پەروەردگارتان فەرمانی پێکردون بۆئەوەی خواناس و پارێزکاربن .**

**کەواتە کەسێک بڵێت من شوێن ڕێبازی خوا ئەکەوم وە شوێن ڕێچکەیەکی (حیزبێکی) ترئەکەوم ئەوە فەرمانی خوای شکاندووە وە لەفەرمانی خوا دەرچووە .**

**وەزانایان کاتێک ئەم ئایەتە باس ئەکەن ئەم دوو فەرموودەیە باس ئەکەن**

**فەرموودەی یەکەم:**

**پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم)**دەفەرمووێت:**( خَطَّ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا خَطًّا، وَخَطَّ عَنْ يَمِينِهِ خَطًّا، وَخَطَّ عَنْ يَسَارِهِ خَطًّا، ثُمَّ قَالَ: «هَذَا سَبِيلُ اللَّهِ» ، ثُمَّ خَطَّ خُطُوطًا فَقَالَ: «هَذِهِ سُبُلٌ، عَلَى كُلِّ سَبِيلٍ مِنْهَا شَيْطَانٌ يَدْعُو إِلَيْهِ» ، وَقَرَأَ {أَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ} [الأنعام: 153] فَتَفَرَّقَ بِكُمْ، وَهَذَا الْكَلَامُ قَدْ رُوِيَ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ نَحْوَهُ أَوْ قَرِيبًا مِنْهُ )

**واتە:ڕۆژێک پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **خەتێکی ڕێکی کێشا وە چەند ڕێگایەکی لەسەر ئەوڕیگایە کێشا ،فەرمووی ئەمە ڕێگای ڕاستە وە ئەوە ڕیگای خوایە وە ئەو ڕێگەو ڕیچکانەی تر شەیتانی لەسەرە کەبانگەوازی بۆ ئەوڕێگانە ئەکات کە لە ڕێگەی ڕاست جیابوونەتەوە ،وە ئەوجار ئەو ئایەتەی خوێند** (انَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ) .

**فەرموودەی دووەم:**

**پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم)**دەفەرموێت:**(فترقت اليهود على إحدى وسبعين فرقة، وافترقت النصارى على اثنتين وسبعين فرقة، وستفترق هذه الأمة على ثلاث وسبعين فرقة كلها في النار إلا واحدة، قيل: من هي يا رسول الله؟ قال: من كان على مثل ما أنا عليه وأصحابي .)

وفي بعض الروايات :هي الجماعة .رواه أبو داود والترمذي وابن ماجه والحاكم سلسلة الأحاديث الصحيحة رقم:1492)

**واتە:جولەکە دابەش بوون بۆ حەفتاویەک بەش ،وەگاورەکان دابەش بوون بۆ حەفتاو دووبەش ،ئومەتەکەم دابەش ئەبێت بۆ حەفتاو سێ بەش هەمووی بۆئاگرە ئیلا یەک کۆمەڵی نەبێت ،وتیان ئەوکۆمەڵەیە کێیە ئەی پێغەمبەری خوا** (صلى الله عليه وسلم) ؟؟**فەرمووی:ئەوانەن کەلەسەر ئەو ڕێبازەن کەمن و هاوەڵانمی لەسەرە .**

**وەچەندەها فەرموودەی تریش هەن لەسەر نادروستی حیزبایەتی .**

**کەواتە کوڕی خۆم ئێستا بابزانین کام لەوسێ کەسەی تۆباست کرد کامیان ڕاست.**

یەکەم کەس ئەوکەسەبوو کەئەیووت  حیزبایەتی درووستە ئەمەش بەناوی بانگەوازەوە چەندەها ئایەتمان باسکرد کەحەرامە ئایاشتێک حەرام بێت ئەتوانرێت بانگەوازی پێبکرێت نەخێر کەواتە ئەم کەسانە لەپێناوی دونیادا یان لەپێناوی پلەوپایەیەکدا ئەوکارەئەکەن .

وەکەسی دووە میش نە پێ یان ئەلێت ئەم کارەتان باشە ،نەئەشڵێت خراپە ئەم کەسە هیچ سودێکی پێناگا ئەگەر پێیان بڵێت باشە چونکە لەحیزبەکەیا نییە بەڵام ئەگەر بڵێن خراپە ئەوە ئەکەونە بەرلۆمەی ئەو کەسانەوە کە حیزبایەتی ئەکەن کەواتە ئەمانە تاقەتی سەرئێشەیان نییە.

سێیەم کەسیش: کەباستکرد ئەوکەسانەن کە پێیان ڕازینین وە ڕەدیان ئەدەنەوە لەسەر حیزبایەتی لەناو ئیسلامدا،ئەمانە چەند کەسێکن نەسودی دنیاییان پێئەگات چونکە ناگەنە پلەو پۆست وە دیسان ئەکەونە بەر لۆمەی کەسەحیزبێکان چەندەها ناو و ناتۆرەیان لێدەنێن وە بەس لەبەر ئەوەش ئەی کەن کەئەجریان لای خوای گەورە هەبێت .

وتم دەستت خۆش زۆر بەجوانی تێگەشتم کەئەمڕۆ کێ لەسەرهەقە لەوبارەیەوە کەباسمان کرد

وتی :خواباشترت تێبگەیەنێت وە وتی کوڕی خۆم یەک ئامۆژگاریت ئەکەم لێم وەرگرە ،وتم :بەڵێ

**وتی: معاویە ڕەزای خوای لێبێت نامەیەکی نارد بۆ عائشە ڕەزای خوای لێبێت فەرمووی فەرموودەیەکم بۆ بنێرە نەسیحەتم بکە لەفەرموودەکانی پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم)**عایشە فەرمووی پێغەمبەری خوا**(صلى الله عليه وسلم) **فەرموویەتی**

:( كتب معاوية إلى عائشة أم المؤمنين رضي الله عنها أن اكتبي إلي كتابا توصيني فيه ولا تكثري علي فكتبت عائشة رضي الله عنها إلى معاوية سلام عليك أما بعد فإني سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول( من التمس رضاء الله بسخط الناس كفاه الله مؤنة الناس ومن التمس رضاء الناس بسخط الله وكله الله إلى الناس والسلام عليك حدثنا محمد بن يحيى حدثنا محمد بن يوسف عن سفيان الثوري عن هشام بن عروة عن أبيه عن عائشة انها كتبت إلى معاوية فذكر الحديث بمعناه ولم يرفعه كمل كتاب الزهد ويليه كتاب صفة القيامة)(كتاب صفة القيامة والرقائق والورع)(صحيح)(الجماع الصحيح سنن الترمذي(2414)

**واتە : هەرکەسێک خەڵک لەخۆی ڕازی بکات بە تورەبونی خوا ئەوە خوالێی ناڕازی دەبێت و خەڵکیشی لێی ناڕازی دەبێت ، وە ئەگەر هەدەفی ڕەزابونی خوابێت باخەڵکیش لێیناڕازی بێت باگوێ نەداتێ نیەتی ئەوەنەبێت خەڵک ڕازی دەبێت یان نا ، خوالێی ڕازی دەبێت و خەڵکی باشیش هەر لێی ڕازی دەبێت .**

**کەواتە لەخواپەرستیدا لە ژیانی ڕۆژانەدا ئەبەدەن سەیری خەڵک مەکە خەڵک دەڵێت چی ناڵێت چی ڕازی دەبن یان ڕازی نابن دائیمە باهەوڵمان بۆڕازیبونی خوابێت بزانە خوای گەورە لێت ڕازییە یان نا ،کە خوا لێت ڕازی بوو خەڵکی چاکیش هەر لێت ڕازی دەبێت بەڵام کە خوای گەورە ڕازی نەبوو ئەو هەموو خەڵکەی دونیا ئەتوانن تۆ لەئاگری جەهانم ڕزگارکەن ، نەواللە ناتوانن**

**وتم دەست خۆش بۆئامۆژگاریەکەت ،وتی مەڵێ دەست خۆش بڵێ خوای گەورە پاداشتت باتەوە**

**منیش وتم خوای گەورە پاداشتت باتەوە لەدونیاو لەقیامەت ئەویش وتی بارک الله**

**وتم باپرسیارێکی ترت لێبکەم ،وتی فەرموو کوڕم**

**وتم هەندێک کەس سەرپێچی کردنی فەرمانی سەرۆکی وڵات بەباش ئەزانن ،وەهەندک کەسیش سەرۆکی وڵات بەوەلی ئەمری خۆیان ئەزانن وە بەقسەیان ئەکەن لەکاری چاکەیا وە گوێڕایەڵی ناکەن لەکاری خراپەدا ،وە هەندێک کەس سەرۆکی وڵات بەکافر ئەزانن ، ئایە ئەمانە کامیان لەسەر هەقن کامیان ڕاستن؟**

**وتی کوڕم ئەوەی کە سەرپێچی فەرمانی وەلی ئەمر ئەکەن وە ڕەخنەی بەردەوامی لێئەگرن ئەم کەسانە کەسانێکی حیزبین بۆیە بەقسەی ناکەن ئەوکەسانە سەرۆکی حیزبەکەیان بەوەلی ئەمری خۆیان ئەزانن وە ئەوەی ئەو بیلێت بەقسەی ئەکەن ئەوەی ئەو نەیلێت بەقسەی ناکەن وە هەوڵیان بۆئەوەیە بگەنە دەسەڵات.**

**وەکەسی دووە میش ئەوکەسانەن کەشوێن فەرموودەی پێغەمبەری خوا(**صلى الله عليه وسلم**)کەوتون کەفەرموویەتی:خوای گەورە بپەرستن هیچ شەریکی بۆبڕیار نەدەن، وەخوا کاتێک لەئێمە ڕازییە هەمووومان دەست بگرین بەدینی خواوە تەفرەقە نەکەین ،وە اخلاص تان هەبێت بۆ ئەوکەسەی کەخوای گەورە کردویەتی بۆ وەلی ئەمرتان دوعایان بۆبکەن خوای گەورە هیدایەتیان بدات و ئامۆژگاریان کەن .**

**وەهیچ هەڵەیەک ڕوی نەداوە لەژیانی مرۆڤایەتیدا ئیلا بەهۆی یەکێک لەوسێ ئەسڵەی باسمان کرد، ئەگەر هەرمرۆڤێک یان هەروڵاتێک کەسەکانی ناوی ئەوسێ خاڵەیان تێدانەبێت ئەوە ئەو وڵاتە زۆر بەخۆشی ئەژین ،وەخوای گەورە بەرەکەت ئەڕژێنێت بەسەریاندا .**

**وە چەندەها فەرموودەی تر کە پێغەمبەری خوا**(صلى الله عليه وسلم)**فەرموویەتی گوێڕیەڵی وەلی ئەمربکەن .**

**وە ئەوکەسەی سەرۆکی وڵات بەکافر ئەزانێت ئەوە کەسانێکی توندڕەون وە تەکفیرین ئەوانە خەڵک بە کافر ئەزانن بەبێ بەڵگەیەکی ڕاست وە بەکافردانان زۆر بەلایانەوە ئاساییە ،وە ناترسن لەبەکافر دانان .**

**ئێمەی ئەهلی سوننە ئەترسین خەڵک بەکافردانیێین چونکە پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم)**فەرموویەتی: هەرکەسێک بە کەسێک بلێت کافر ئەگەر ئەوکەسە کافر نەبێت ئەوە خۆی کافربووە .**

**باشتێکی خۆشت بۆباسکەم ڕۆژێک کەسێک هات وتی تۆ سەرۆکی وڵاتت بەلاوە چییە وتم واللە بەلای منەوە موسوڵمانە وتی ئەی خوای گەورە نافەرموێت** ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ **﴿المائدە﴾**

**هەرکەسێک حوکم بەقورئان نەکات کافرە وتی وایە !؟وتم بەڵێ وتی کەواتە سەرۆکی وڵات کافرە، وتم باشە من پرسیارێکت لێدەکەم ،قورئان بۆکێ دابەزی؟**

**وتی بۆ پێغەمبەری خوا**(صلى الله عليه وسلم) **وتم ئەبێت ئەویش بۆمان ڕونکاتەوە چونکە بۆئەو دابەزیوە وتی بەڵێ ڕاستە وتم دەی پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **خۆ نەجاشی موسوڵمان بوو حوکمی بەقورئان نەکرد ئایە پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **بەکافری دانا یان کەمرد نوێژی مردووی لەسەرکرد ؟**

**وتی باشە شتێکی تر خوای گەورە نافەرموێت** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ ﴾ **واتە هەرکەس هاو پەیامانی بکات لەگەڵ جولەکەو گاورەکان لەوان حیساب ئەکرێت چونکە ئەوان کافربوون ئەمیش کافرە.**

**وتم پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم)**هاوپەیمانی لەگەڵ موشریکدا کردووە ،سوڵحی حودەیبیە ئەوەبوو کەپێغەمبەری خواو هاوەڵانی موشریکەکەنان نەیان هێشت عەمرەبکەن ئەویش هاوپەیمانی کرد لەگەڵیان .**

**هیچ قسەیەکی پێنەما وتم گوێبگرەو جوابم بەرەوە ؟وتی فەرموو**

**وتم ئایا سەرۆکی ولآت کافرە یان نا؟ وتی کافرە وتم باشە (من لم یکفر کافر فهو کافر )ئەوەی کافرێک بەکافر نەزانێت کافربووە؟ وتی بەڵێ وتم کەواتە ئێستا من کافرم بەگوێرەی ئەوە چونکە من سەرۆکی ولآت بەکافر نازانم ؟وتی بەڵێ وتم ئەی ئەوکەسانەی حیزبین لای تۆچین وتی کافرنین بەلآم زۆرباشیش نین وتم باشە ئەو حیزبیانە کافرنین وە حیزبیێکان من(اهلی سوننە) بەکافر نازانن وتی**

بەڵێ وتم دەی کەواتە ئەوانیش کافربوون لەبەر ئەوەی منیان بەکافر نەزانی چونکە هەرکەسێک کافرێک بەکافرنەزانێت کافربووە کەواتە من کافربووم ئەوانیش منیان بەکافر نەزانی کەواتە ئەوانیش کافرن وە تۆش کافر بوویت چونکە حیزبیەکانت بەکافر نەزانی خۆ ئەوانیش کافربوون ،تۆ موسوڵمانت نەهێشت.

بۆیە ئامۆژگاریم کرد وتم واز لەوفیکرە توندڕەوییە بهێنە برۆ عیلم بخوێنە .

جامەبەستم چییە کوڕی خۆم ئەم کەسانە کەسانێکی توند ڕەون ئەگەر لەوکاتەیا دەسەڵاتی هەبوایە ئەم هەموو خەڵکەی ئەکوشت چونکە کافر خوێنی و ماڵی حەڵاڵە .

وتم خواپاداشتت باتەوە زۆر جوان تێگەشتم ئێستا بۆم دەرکەوت کێ لەسەر هەقەو کێش لەسەر ڕێگەی ناهەقییە

وتی کوڕی خۆم خواباشترت تێبگەیەنێت ،ئیتر کاتیش درەنگی کرد هەڵسە بچۆ بنوو وتم باشە بەڵام پرسیارم ماوە ،وتی فەرموو پرسیاربکە وتم نا بابۆ سبەی شەو بێت ،وتی بەئارەزوی خۆت هەڵسام ڕۆشتم بۆژورەکەی خۆم چومە ناوجێگا هەربیرم لەقسەکانی ئەو ئەکردەوە خەوم لێ نەئەکەوت بۆیە هەڵسام کتێبەکانی مەکتەبم هێنا سەیرم ئەکردو ئەم خوێندەوە تا خەوم هات چوم خەوتم .

بەیانی هەڵسام نان و چای بەیانیم خوارد وتی وەرە کوڕم ئەتبەم بۆ قوتابخانە لەڕێگا لەناو سەیارەکەیا پرسیاری شوێنی نوێژی لێکردم لەمەکتەب وتم ڕێگە

نادەن وتی چۆن وتم نایەڵن وتی خۆم یەم قسە لەگەڵ مودیرەکەیا ئەکەم من و باوکم چوینە قوتابخانەو چوینە لای مودیر باوکم سەلامی کرد لێیان وتی تۆ برۆ کورم دوای چارەکێک هاتە دەرەوە وتی ئێوە لەم مەکتەبەیا سێ کەس نوێژ ئەکەن وتم بەڵێ وتی دەی مودیر رازی بووە لەکاتی نوێژەکانا بچنە ژورەکەی ئەو نوێژ بکەن منیش زۆرم پێ خۆش بوو ئیتر باوکم رۆشت منیش چومە ناو پۆل .

شەو کەهاتمەوە سەیرم کرد میوانمان هەیە زۆرم پێناخۆش بوو چونکە حەزم ئەکرد لەگەڵ باوکما قسە بکەم ،چومە ژورەوەماڵمان پربوو لەمیوان ،خزمی ماڵ باوکم بوون لە کەرکوکەوە هاتبوون دوو کوری تەمەنی منیان لەگەڵ بوو دوای ئەوەی نانمان خوارد باوکم وتی کورم لەگەڵیان بچۆرەدەرەوە ئەوان زۆر شارەزانین ئەو شەوەش لەگەڵ ئەوانا ئاوا بەرێم کرد بەڵام شەوێکی ناخۆشیش نەبوو .

شەوەکەی هاتمەوە زۆر هیلاک بووم خەوتم بەیانی هەڵسام بۆنوێژی بەیانی لەدوای ئەوە واجبەکانی مەکتەبم سەعی کرد و لەبەرم کردن ،بەیانی چوم بۆدەوام هەروەک رۆژانی ئاسای لەگەڵ هاورێکانم قسەمان ئەکرد دانەیەک هات لەوسێ کەسەی کەنوێژمان ئەکرد وتی کورێک هەیە لەودیو تەحەدای مۆستای ئاینی کردووە لەسەر ئایەت کەخوای گەورە زەوی بە هەشت رۆژ یان شەش رۆژ دروست کردووە هەردووکی بەڵگەی ئایەتی پێیە وە پۆل بە پۆلیش ئەگەرێ تەحەدا ئەکات ئەم دەرزە بەس پۆلی ئێمە ماوین بەس ئێمەش نوێژ کەرین ئەم سێ کەسە چارمان نەبوو هیچمان نە ئەزانی چی بکەین چی نەکەین هات و قسەی خۆی کرد

**ئێمەش قسەمان نەکرد تەنانەت مامۆستای وانەکەمان دەرزی ئینگلیزی ئەوتەوە مەسیح بوو پێی خۆش بوو ،من زۆرم پێناخۆش بوو .**

**شەو کەهاتمەوە بیری پرسیارەکانی خۆمم نەمابوو مێشکم زۆر مەشخوڵ بوو ،باوکم وتی ها کوڕم پەشۆکاوی ،وتم باوکە لە قورئاندا دوو ئایەتی دژ بەیەک هەیە وتی نەک دوو ئایەت فەرموودەیەک و ئایەتێکیش نییە وتم ئەی کوڕێک ئەمڕۆ باسی دروست بوونی زەوی کرد دوو ئایەتی هێنایەوە دژی یەک بوون ،وتی موستەحیلە شتی وا ،وتی بەیانی چەن شەممەیە؟وتم پێنج وتی زۆرباشە بەیانی هەموویان دەعوەت کە بۆباخەکەی خۆمان بزانە ڕازی ئەبن بۆ هەینی بچین وتم باش مەکتەبەکەی ئێمە نموونەی بوو وە چوارسەد تەلەبە بووین وە پاسی تایبەتمان هەبوو ،وەباوکم کەسێکی توجار بوو دەوڵەمەند بوو .**

**بۆبەیانی یەکەم کەس چووم بەوکەسەم وت کە وتی دووئایەت دژی یەکن ئەو ڕازی بوو پۆل پۆل گەڕام قوتابخانەکەمان فەرقی کوڕو کچی نە ئەکرد بۆیە بەس مامۆستاکان نەهاتن وە بیست قوتاتابی نەهاتن ئەگینا مودیر و معاون مودیر هاتن ،چووین بۆباخەکە زۆر بەی تەلەبەکان بەپاس نەئەهاتن هەبوو باوکی ئەی هێنا یان سایەقی باوکی وە ئێمەش باخەکەمان زۆر گەورەبوو دوای ئەوەی قسەی خۆشوو نانمان خوارد باوکم ویستی قسەبکات سەوتی زاڵ نەبوو بۆیە ئەوتەلەبانەی کە تەسجیلیان هێنابوو بۆ گۆرانی لێدان باوکم بەوە قسەی کرد .**

**وتی** : الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله

**پێشەکی بەخێرهاتنی هەموو تان ئەکەم بەخێربێن ،کاتێک ئەم قسانەی ئەکرد ژمارەیەکی کەم قوتابی گوێیان لێئەگرت ،کاتێک کەوتی لە قوتابخانەکات دەنگۆی ئەوە هەیە دوو ئایەت دژی یەکبن ،کاتێک ئەمەی وتت هەموو قوتابییەکان بێدەنگ بوون غەیری دەنگی چۆلەکە دەنگی هیچی کە نەدەهات ،باوکم وتی ئەوکەسە کێیە کە ئەلێت دوو ئایەت دژی یەکن ئەوکەسەی ئەوقسەی کردبوو وتی من وتی وەرە بۆلام مایکەکەی پایەدەستی وتی فەرموو پرسیاربکە .**

**وتی خوا لە قورئاندا ئەفەرموێت :لەسورەتی (فصلت) ئایەتی نۆ بۆ دوانزە زەوی بە هەشت ڕۆژ دروست بووە بەلآم لەسورەتی (الاعراف) ئایەتی پەنجاو چوار ئەفەرموێت بە شەش ڕۆژ دروست بووە .**

**باوکم وتی سورەتی فصلت ئایەتی نۆ تا دوانزە ئەمەیە** ﴿ قُلۡ أَئِنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ
بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ وَتَجۡعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٩ وَجَعَلَ فِيهَا
رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ ١٠ ثُمَّ
ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ
١١ فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا
بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ١٢ ﴾

**واتە :زەوی لە<u>دوو</u> ڕۆژدا دروست کردووە ،وەئەوشتانەی ناوی شاخ و دەریا و بەحر لە <u>چوار</u> ڕۆژدا دروست کردووە ،وە ئاسمانەکانی دروست کردووە لەماوەی <u>دوو</u> ڕۆژدا**

دوو+چوار+دوو=ئەکاتە هەشت

وە ئایەتی الاعراف خوای گەورە ئەفەرمویێت:﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾.

واتە:جیهان بەگشتی دروستکردووە بە شەش ڕۆژ

ئەگەر ئاوا سەیری کەیت ئەلێیت ئەوە ئەو دوو ئایەتە دژی یەکن وەرە بامن ئەوەت تێگەیەنم ،وەرەقەیەکی هێنا کردی بەشەش کەرتەوە .

وتی ئەمە دووان بگرە ئەمە دروست بوونی زەوی ئەمەش دوانی کەبگرە ئێستا چەنت پێیە چوار ئەمە دروست کردنی شاخەکان و بەحرەکان وتی ئەمە دوانی کە بگرە دروستکردنی ئاسمان

دووان+چوار+دووان=هەشت ئەی تۆ چەن وەرقەت پێیە شەش ،بۆچی تۆ شەش وەرقەت پیێیە خۆمن هەشتم یا بەتۆ .

درووست کردنی زەووی دوو+درووست کردنی شتەکانی ناوی شاخ و بەحر (دوو)=چوار ئەمەیە لەئایەتەکەدا ئەفەرموێت چوار دوانەکەی پێشوش حسێبە +دوو ڕۆژی دروست کردنی ئاسمان= ئەمە شەش ئایا ئێستا هیچ پێچەوانەیەک هەبوو بەبەینی ئەم دوو ئایەتەدا وتی نەخێر تەواو باوەڕم کرد.

زۆر بەی تەلەبەکان چەپڵەیان بۆباوکم لێدا ڕۆژێکی نموونەی بوو لەژیانمدا زۆر خۆش بوو ئێوارە کەهاتینەوە لەڕێگا زۆر سوپاسم کرد وتم باوکە چەندت سەرف کرد وتی خوا پڕی ئەکاتەوە (تێبینی) کاتێک گەشتینەماڵەوە زۆر هیلاک بووم سەرم ئازارێکی زۆری هەبوو یەکسەر خەوتم .

تێبینی :ڕێک واش دەرچوو من بە پارە ئەم خوێند ساڵانە ،لەکۆتای ساڵدا مودیرەکە وەکو ڕێزێک بۆم پارەی ئەو ساڵەی لێوەر نەگرتم .

کە ڕۆشتمەوە بۆ دەوام دڵم زۆر خۆش بوو لەسەر ئەو بابەتەی باوکم ڕونی کردەوە

چومە پۆلەوە لەگەڵ ئەوسێ قوتابیە دانیشتم کەبەس ئەو سێ یەمان نوێژمان ئەکرد لەو قوتابخانەیەدا .

ئێوارە هاتمەوە بۆ ماڵەوە نانی ئێوارەم خوارد ،لەگەڵ باوکم چوین بۆ نوێژی عیشا وە دوای ئەوەی لە نوێژ هاتینەوە باوکم چوو کتێب بخوێنێتەوە منیش چووم سەعی بکەم،دوای ئەوەی لەسەعی کردن تەواو بووم ڕۆشتم بۆلای وتم کاتت هەیە پرسیارەکان تەواو کەین ؟؟ وتی فەرموو کوڕم .

وتم :کەسانێک هەن ئەڵێن لەسەر دینی باوک و باپیرانمان ئەڕۆین ئایادینی باوک و باپیرانمان هەر ئیسلام نەبووە ؟وە ئەوکەسانەش کە ئەڵێن نەخێر ئەبێت لەسەر قورئان و فەرموودە بڕۆین ئایا ئیسلامیش هەر قورئان و فەرموودە نییە !! ئیتر فەرق لەبەینی ئەم دوانە چییە؟؟

وتی :کوڕی خۆم فەرق لەبەینی ئەم دوانە زۆر زۆرە ئەو کەسانەی کە ئەڵێن بالەسەر دینی باوک و باپیرانمان بڕۆین واتە ئەگەر باوک و باپیرانمان شیرکیان

**هەبوو ئەبێت ئێمەش شوێن ئەوان بکەوین وە ئەگەر هاواریان کردبێت بۆ غەیری خوا ئێمەش ئەبێت شوێن ئەوان بکەوین ئەمە جەهالەتە چونکە هەموو کافرەکان کە پێیان ئەوترا شوێن ئەو ئاینە بکەون کە لەلایەن خواوە بۆتان دابەزیوە ئەیانوت ئێمە شوێنی باوک و باپیرانمان ئەکەوین ،وەک خوای گەورە ئەفەرمووێت:**﴿ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ ٢٣ ﴾**﴿الزخرف﴾**

**واتە:هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە بۆلای هیچ شارێک کە لە خۆش گوزەرانیابن نەیان وتبێت ئێمە باووباپیرانی خۆمانمان بینیوە پابەندی بیرباوەڕێک بوون بێگومان ئێمە چاو لەوان دەکەین شوێن ئەوان دەکەوین.**

**وە لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە ئەفەرموێت :** ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلۡ نَتَّبِعُ مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ٢١ ﴾**﴿لقمان﴾**

**واتە:کاتێک پێیان وترابا شوێن ئەوبەرنامەیە بکەون کە خواناردویەتی ئەوە هەر شوێن ئەو شتانە ئەکەوتن کەباوک و باپیرانیان لەسەر بوو ،ئایا ئەگەر شەیتان بانگی کردن بۆ دۆزەخ(باوک و باپیرانیان ) ئایا هەرشوێنی دەکەون .**

کوڕی خۆم باوک و باپیرانمان ئەگەر شتێکیان کردبوو ئەگەر لەقورئان فەرموودەدا هەبوو ئەوە ئەیخەینە سەرچاومان بەڵآم ئەگەر شتێکیان کردبوو پێچەوانەی قورئان و فەرموودە بوو ئەوە بەقسەیان ناکەین .

وتم کەواتە ئەوان تاوان باربوون لەسەر ئەوئیشەی کە کردوویانە ،وتی بەڵێ بەڵآم بەمەرجێک ئەوکەسانە عیلمیان بەو تاوانە هەبوو بێت بەڵآم هەرکردبێتیان .

وتم خوا پادشتت باتەوە بەوەڵآمی ئەم پرسیارەش ،ئەتوانم پرسیاری تربکەم ؟

وتی فەرموو کوڕی خۆم .

وتم ئەمڕ ئەو کەسانەی وەک سەلەفیەکانن کەمن وە ئەوانەی تر زۆرن وەکو حیزبیەکان سۆفی یەکان ..هتد، ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەئەوان لەسەر هەق بن ؟؟

وتی کوڕی خۆم لە ئیسلامدا زۆری شەرت نییە بەڵکو ئەو تەرازووە تەرازوی جاهیلەکانە کە شوێن زۆری ئەکەون ،وە خوای گەورە ئەفەرموێت :﴿وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَـٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَـٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ ﴾ **الإسراء**

واتە:تازە هەقوو ڕاستی هاتووە بەرپابووە بەتاڵ و ناهەقی تەفروتونا بووە ، بەڕاستی ناحەق هەر بەتاڵە هەرتیاچووە هەرگیز جێگای نەبۆتەوە و بەزیوە.

کەواتە کوڕی خۆم ئەوە هەقوو ڕاستیە لەقورئانە ئیتر ئەوەی شوێنی ئەوە کەویت لەسەر هەقە ئەوەشی وازی لێبێنێت شوێن بەتاڵ کەوتوە .

بانمونەیەکی ئەقڵیت بۆبهێنەمەوە ئایا تۆ هونەری ڕوتیت پێباشە کە چەندەها کەس خۆیان ڕوت ئەکەنەوە ؟؟

وتم بێگومان نەخێر ،وتی دەی هەموو ئەوڕپا ئەوەیان پێباشە  ئایا زۆری ئەبێت بەوەی شتێکی خراپ بکاتە باش! نەخێر ،بۆیە زۆری شەرت نییە لەشوێن کەوتندا بەڵکو کێ لەسەر هەقە شوێن ئەوکەسە بکەوە جا هەرکەسێک بێت .

وتم پرسیارێکی تر ؟وتی فەرموو کوڕەکەم .

وتم باشە ئەو کەسانەی کەشوێن ئەو مەنهەجە ئەکەون کە ئەمڕۆ سەلەفیەکان لەسەری ئەڕۆن تەنها کەسانێکی لاوازو هەژارن وە ئەگەر شوێن ئەو مەنهەجە بکەون یان نەکەون هیچ نابن بە دیاردە لەناو کۆمەڵگادا؟؟

وتی کوڕی خۆم ئەم قسەی کەتۆ کردت ڕێک قسەی ئەوکەسانەیە کە لەسەر دەمی نوح (علیه السلام) کاتێک کە نوح بانگەوازی کردن ئەوانیش وتیان چۆن باوەڕ بهێنین بەوبانگەوازییەی تۆ کەتەنها ئەوکەسانە شوێن تۆ ئەکەون کە داماو هەژارن ،ئەمەش ئەو ئایەتەیە کەخوای گەورە باسی ئەوە ئەکات

﴿۞ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ﴿١١١﴾ ﴾﴿الشعراء﴾

وە خوای گەورە خۆی ئەزانێت کێ شایەنی هیدایەتە وە کێ هیدایەت ئەیات گرنگ نییە هەژاربێت یان دەوڵەمەند دەسەلآت داربێت یان بێ دەسەلآت وەک خوای گەورە ئەفەرمویێت ﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾﴿الإنعام﴾

**ئایا خودا نازانێت کێ شایەنی هیدایەتە؟؟**

**وتم زۆر بەباشی تێگەشتم خودا پاداشتت باتەوە**

**وتم پرسیارێکی تر؟؟ وتی فەرموو**

**وتم زۆربەی کەس ئەمڕۆسەیری مامۆستایان ئەکەن لەسەردین جاهەر مەسەلەیەک بێت ئایا ئەوجیاوازیانەی کەلەنێوانیاندایە مەبەستی من جیاوازی ئیچتیهادی نییە بەڵکو جیاوازیەکانی تر ئایا ئەو خەڵکە چی بکەن شوێن کامیان بکەون ؟؟**

**وتی کوڕی خۆم باشوێن ئەو کەسانەبکەون کە بەڵگەی قورئان و فەرموودەیان پێیە،وە جاهیلەکان کەسانێکیان ئەکردە پێشەنگی خۆیان کە مامۆستایانی فاسق بوون وە قورئان و فەرموودەیان نەئەکردە پێشەنگی خۆیان بۆ خوای گەورە لەسەر ئەمە ئەفەرموێت** ﴿۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡأَحۡبَارِ وَٱلرُّهۡبَانِ لَيَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۗ ٣٤﴾ **﴿التوبە﴾**

**واتە:ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە بزانن وە زۆربەی حاکمەکان وە جوولەکەو قەشەی گاورەکەکن (مامۆستاکانیان) وە ماڵ و سامانی خەڵکیان ئەخواردوو وە بەرهەڵستی ڕێبازو ئاینی خوا دەکەن.**

**وە لەئایەتێکی تردا خوای گەورە ئەفەرموێن**﴿لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓاْ أَهۡوَآءَ قَوۡمٖ قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ٧٧﴾

**﴿المائدە﴾**

واته:زێدەڕەوی مەکەن لەئاینەکەتاندا وە زیادەڕەوی لەسنوری هەق دەربچن وە شوێن ئارەزوی کەسانێک مەکەون کە پێشان گومڕابوون وە زۆر کەسیشیان گومڕاکرد ئەوانیش لە ڕیگەو ڕێبازی ڕاست لایاندا.

کەواتە شوێن کەسێک مەکەوە ئیلا شوێن ئەو قسەیەی بکەوە کە بەڵگەی قورئان و فەرموودەی پێبە.

وتم زۆر باش تێگەشتم دەستت خۆش خوای گەورە پاداشتت باتەوە .

وتم پرسیارێکی تر؟؟ وتی گووێم لێتە کوڕم

وتم : پێشەکی ئەمەویت بلێم بۆچی بەسەلەفییەکان ئەڵێن مەدخەلی؟ ؟

وتی:کوڕی خۆم مەبەستیان زانا شێخ رەبیع بن هادی مەدخەلییە کەیەکێکە لە زاناگەورەکان،بۆیەڕقیان لێیەتی ڕەدی هەموو شوبهەو گومانەکانی حیزبایەتی ئەداتەوە وە زۆر شوبهەی تریش بۆیە ئەلێن مەدخەلی ئەم بوختانە ئەکەن ئەڵێن شوێن مەدخەلی کەوتون، جاکوڕم ئەمە هەر لەزوووەوەئەمە ئیشیانە، زندیقەکان بە اهلی سونەیان ئەوت (الحشویە) ئەیانوت ئیسلام دوو بەشە دانەیەکیان ناوکەکەیەتی کەبریتیە لە ململانێی نێوان سیاسەت ،وەتوێکڵەکەشی بریتیە لە عیبادەت و نوێژو ڕۆژو و ئەمانە .

وە قەدەریەکان بە ئەهلی سونەیان ئەوت (جبری) ،وە جەهمیەکان ئەوانەی کەناو و سیفات بۆ خودا نایەلن بە ئەهلی سونە ئەلێن(مشبە) ،وە خەواریج بە ئەهلی سونە ئەلێن (مورجیئە)،وە تەکفیریەکان بە أهلی سونە ئەلێن(عمیل)،یان ئەیان وت

وەهابی وە ئەمڕۆش ئەڵێن مەدخەلی کە ئەمەش بوختانە ئێمە شوێن هیچ کەسێک ناکەوین ئیلا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەبێت .

وتم : کەسێکی حیزبی گوێم لێبووە لە وتارێکیدا دەڵێت هەتاکو ئەقڵت دانەنێیت ناتوانی ببیت بەمەدخەلی ئایا ئەم قسەیەی ڕاستە؟؟

وتی کوڕی خۆم ئەم قسەیە زۆر دوورە لەڕاستیەوە چونکە ئەوزانایە کە قسەیەکی کردبێت لەسەر قورئان و فەرموودەبووە وە ئەمە شتێکی تازە نییە چونکە قەومەکەی نوح بەنوحیان ئەوت ئەوکەسانە شوێن تۆ ئەکەوت کەسانێکی خۆش باوەڕن وەک خوای گەورە باسی ئەکات و ئەفەرموێت﴿ بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ ﴿٢٧﴾﴾﴿هود﴾

کەسانێکی خۆش باوەڕن ئەوانەی شوێن تۆ ئەکەون ئەی نوح ،ئەمڕۆش ئەگەر شوێن قورئان و فەرموودە بکەویت یان شوێن فەتوای زانایەک بکەویت ئەڵێن ئەمانە بێ ئەقڵن یان خۆش باوەڕن .

وە ئیمام سابونی لەساڵی ٤٤٩ ١کۆچی فەرموویەتی:ئەهلی بیدەع ئەوناو ناتۆرەی لەئەهلی سونەی ئەدەن حاڵی ئەوان وەکو موشریکەکانی سەردەمی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم)کە پێیان دەگوت شاعیر،ساحیر،درۆزن،شێت وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەوانە هەمووی دوورە وە بەهەمان شێوە هەرگروپێکی بیدعی ناوناتۆرە لە اهلی سونە ئەنێن بۆ ئەوەی خەڵکی هەق نەبینێت .

وتم دەست خۆش زۆرباش تێگەشتم خواپاداشتت باتەوە ، وتم پرسیارێکی تر.

وتی: فەرموو کوڕی خۆم گوێم بۆ گرتویت .

وتم: کەسانێک هەن ئەڵێن ئەم مامۆستاو شتانە خۆ وەکو ئێمەن ئیتر ئەم ئامۆژگاری و شتانە چییە ئەمانکەن ئەوان مرۆڤن ئێمەش هەرمرۆڤین ئیتر ئەمەچییە؟ ئەم کەسانە چین بۆ وادەڵێن ؟

وتی: کوڕی خۆم ئەوەی ئەوان ئەیکەن پێی دەوترێ قیاسی فاسد وە ئەمەش شتێکی تازە نییە هەر لەکۆنەوە ئەو کەسانەی کە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) ئەیان فەرموو شوێن ڕێبازەکەی خوا کەون ،ئەوانیش ئەیان وت بۆ شوێن تۆ بکەوین خۆتۆش هەروەکو ئێمەیت مرۆڤیت ئێمەش مرۆڤین ،بەڵێ ڕاست ئەکەن هەردووکتان مرۆڤن بەڵام خوای گەورە خێرو بەرەکەت و فەزڵی ئەڕژێت بەسەر هەرکەسێکدا بیەوێت .

وەخوای گەورە ئەفەرموێت:﴿ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا ﴿١٠﴾ ﴾﴿إبراهيم﴾

وتیان ئێوە بەشەرێکن وەکو ئێمە ،وە بۆئەمڕۆش بەهەمان شێوە کە ئەڵێن کاکە بەقسەی فلآنە مامۆستایەبکەن کە بەقورئان و فەرموودە قسەئەکات ئەلێن بابە ئەمەش بەمرۆڤێکە وەکو ئێمە ،ئێخۆ نەمان وتوە ئەوان مەلائیکەی خوان ئەوانیش مرۆڤن بەڵام ئەوان عیلمیان پێیە خوای گەورە ئەو فەزڵەی بەسەردا ڕشتووە ، کوڕی خۆم من پرسیارێک لەو کەسانە ئەکەم کە ئەم قسانە ئەکەن ئایا بۆچی هەندێکتان دەوڵەمەندن هەندێکتان هەژار خۆ هەردووکتان هەرمرۆڤن ؟؟

**وتم خواپاداشتت باتەوە تێگەشتم ئەوە قیاسێکی فاسدە ،باپرسیارێکی تریش بکەم ،وتی فەرموو کوڕم .**

**وتم :کەسانێک ئەڵێن ئێمە لەقسەی ئەم سەلەفیانە تێناگەین خۆ بەزۆرنییە لێیان تێناگەین ئایا ئەم کەسانە بۆ تێناگەن یان ئەوەیە ئەو بانگەوازی سەلەفیەتە هەڵەیە؟؟**

**وتی: کوڕی خۆم لەسەردەمی پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **ئەو موشریکانە عوزریان بەوە ئەیەنایەوە کە ئەیانوت ئەی محمد** (صلى الله عليه وسلم) **ئەوەی تۆ باسی ئەکەیت ئێمە تێی ناگەین ئیتر بۆچی تاوانیار ئەبین تێناگەین ،وەخوای گەورە ئەفەرمووێت﴿** قُلُوبُنَا غُلۡفٌۢ ﴿٨٨﴾ **﴾﴿البقرە﴾**

**ئەم ئایەتە دوو تەفسیری هەیە یەکەم ئەوەیە کە دڵەکانیان پەردەی پێدادراوە هەق نابینن وە تەفسیری دووەم ئەوەیە کە دڵەکانیان بەرگی تێگیراوە وە ئەڵێن دڵمان پڕە لە عیلم بەڵام ئەوە عیلم نەبوو بەڵکو جەهل بوو کە لەدڵیاندا هەبوو.**

**وە لەسەردەمی شوعەیب** (عليه الصلاة والسلام) **وەک خوای گەورە باسی ئەکات ئەفەرمووێت﴿** يَٰشُعَيۡبُ مَا نَفۡقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ ﴿٩١﴾ **﴾﴿هود﴾**

**واتە: ئەی شوعەیب ئێمە تێناگەین لەزۆربەی ئەوباسانەی کەتۆ دەیلێیت .**

**وە ئەگەر هەربڵێن تێناگەین ئەوە خوای گەورە سزای بۆداناون وەک چۆن سزای ئەوکەسانەی دا کەشوێن پێغەمبەر شوعەیب**(عليه الصلاة والسلام) **نەکەوتن .**

**وە کوڕی خۆم ئەمڕۆش ئەوکەسانە کەئەڵێن تێناگەین یان دڵیان خوای گەورە پەردەی بەسەراداوە یان ئەوەی ڕاست ناکەن وەک قەومەکەی شوعەیب .**

**وتم زۆر باش تێگەشتم خوای گەورە پاداشتت باتەوە ،باشتێکی تریپرسم ،وتی فەرمووکەوڕم.**

**وتم:ئەو کەسانەی واز لەکتێبەکەی خوای گەورە دەهێنن و شوێن کتێبەکانی تر ئەکەون ئایە ئەمانە چۆن کەسێکن ؟؟**

**وتی کوڕی خۆم ئەم کەسانە لەهەموو سەردەمێکدا هەن وە لەسەردەمی پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **کاتێک پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **پێی فەرموون شوێن ئەو کتێبە بکەون لەلایەن خواوە دابەزیوە بۆتان ئەوانیش وازیان لیهێناو شوێن سیحر کەوتن وە ئەوەی واز لەشتێکی هەق بهێنێت ئەوە دڵنیابە کوڕم شوێن شتێکی ناهەق ئەکەوێت،وەکو خوای گەورە ئەفەرموویێت**﴿نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ كِتَـٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَـٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ ﴿١٠٢﴾ ﴾**﴿البقره﴾**

**واتە:دەستەیەک لەخاوەن کتێبەکان کتێبی خوایان پیشتگوێ خست و خۆیان لێ گێل کرد هەروەک هەواڵی وایان نەبیستبێت،جا وازیان لەکتێبی خوا هێنا شوێن ئەوە کەوتن کە شەیتان ئەی خوێند دەربارەی موڵکی سولەیمان**(عليه الصلاة والسلام)

**وە کوڕی خۆم بەهەمان شێوە ئەوکەسانەی کە بانگەوازی ئەکەن کاتێک پێیان ئەڵێت وەکو پێغەمبەران**(صلى الله عليه وسلم) **بانگەوازی بکەن ،بەڵام گوێ بەوە نایەن یەن حیزبایەتی ئەکەن نەک بێن بەوشێوەیە بانگەوازی کەن کە پێغەمبەران**(صلى الله عليه وسلم) **بانگەوازیان ئەکرد بە (توحید) بەڵام ئەمرۆ بانگەوازیان بۆ حیزبەکەیانە نەک بانگەوازی بۆ توحید .**

**وتم خواپاداشتت باتەوە ئەمەوێت پرسیاری تربکەم ،وتی فەرموو کوڕم**

**وتم:هەندێک کەس باوەڕیان بەهەندێک شتی لە عادەت دەرچوو نییە وەک موعجیزە و کەرامەت و سیحر ئایا ئەمانە لەسەر هەقن یان ئەو کەسانەی باوەڕیان پێیەتی ؟**

**وتی کوڕی خۆم ئەو سێ شتە لە عادەت دەرچووە کەباستکرد دوانیان شەرعین دانەیەکیان حەرامە ئەو دوانەی شەرعین یەکەمیان (موعجیزە) ئەوە یە لەسەردەستی پێغەمبەران**(صلى الله عليه وسلم ) **ڕوودەدات ،موسا** (عليه الصلاة والسلام) **داری فڕێئەدا ئەبوو بەمار وە عیسا(علیە السلام) مردووی زیندو ئەکردەوە بەئیزنی خوا وە خوای گەورە گەورەترین موعجیزەی بۆ محمد نارد** (صلى الله عليه وسلم)**ئەویش قورئانە ، وە ئەو هەموو موعجیزانە بۆئەوەی خەڵکی بگەڕێنەوە بۆلای خوا ،وە دووەمیان (کەرامەت) وەک (أصحاب الکهف) کە ئەوەندە ساڵ خەوتن بەبێ ئەوەی هیچیان لێبێت ئەو سەردەمە خەڵکی باوەڕیان بەزیندوو بونەوە نەبوو وە خوای گەورە ئەمەی نیشاندان ئەم دوانە شەرعین لەدیندا هەن ،سێیەم (سیحر)ئەمەیان لەسەر دەستی ئەو کەسانەیە هاوار بۆ غەیری خوا ئەکەن وە**

شەریک بۆ خوابڕیار ئەدەن شمشێر ئەیا لەخۆی مار ئەخوات موس ئەخوات وە ئەوەی ئەمڕۆئەوانە ئەیکەن هیندۆسە گاپەرستەکانیش ئەیکەن ،وە ئەوان شمشێر کاریان تێناکات کە ئەبیەن لەخۆیان،صەحابەی پێغەمبەر لەکاتی جیهادا ئەکوژران ئایا ئەمان لە صەحابە ئیماندار ترن ،ئەمەش ناشەرعییە وە هەرکەسێکیش باوەڕی بەسیحر هەبێت سیحربکات کافرە .

وتم تێگەشتم پێویستە باوەڕمان بە موعجیزەو کەرامەت هەبێت وەبێ باوەڕبین بە سیحر .

شەو گار بەرەو درەنگی ئەچوو وتم باتائێرە بێت من ئەبێت بخەوم بەیانی ئەبێت بچم بۆ قوتابخانە، وتی فەرموو کوڕی خۆم ،ڕۆشتم بخەوم بیرم هەر لای وەڵامی پرسیارەکانی ئەم شەوبوو ،بەیانی ڕۆشتم بۆ قوتابخانە چومە پۆلەوە مامۆستای ئینگلیزی مان کەسێکی مەسیحییە لە دەرزەکەیا وشەی (god)ی تێدابوو واتە خودا وتی ئێمەی مەسیح ئەڵێین سێ خوا هەیە منیش لەبەر خۆمەوە وتم ئێمەش ئەڵێین یەک خوداهەیە ،مامۆستا وتی وتت چی هەڵبسە سەرپێ وتم یەک خوا هەیە مامۆستاوتی بەچیائەزانیت وتم خوای گەورەئەفەرمویت﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾﴿أخلاص﴾ وتی دابنیشە قسەمەکە ،منیش دانیشتم خەیاڵم لای دەرزنەما هەربیرم لای ئەوەبوو بە عەقڵی بۆی بسەلمێنم بیرم کردەوە وتم ئەی بەم بۆلای باوکم ،دوای ئەوەی دەرزەکە تەواو بوو وتم مامۆستا ئەکرێت ئەم نیوەڕۆیە بێیت بۆ ماڵ ئێمە مامۆستاش ڕازی بوو منیش چومە ماڵەوە لەگەڵ مامۆستا باوکم لەماڵ نەبوو تەلەفونم بۆ باوکم کرد بێتەوە بۆ ماڵەوە ،دوای ئەوەی باوکم

هاتەوە نانمان لەگەڵ مامۆستا خوارد ،چوینە ژووری میوان وتم مامۆستا تۆوتت سێ خوداهەیە ئەو خودایانە چیوچین مامۆستا وتی عیسا و دایکی کە مریەمە وە خودا خۆی . باوکم وتی مامۆستا عیسا خالقە(دروستکەر) یان مەخلوقە(دروستکراو) ؟؟ مامۆستا تۆزێک وەستا وتی هەم خالقە هەم مەخلوقە، باوکم وتی چۆن شتی وا ئەبێت یان ئەبێت خالق بێت یان ئەبێت مەخلوق بێت ،مامۆستا هەر خۆی ئەدزیەوە لەوپرسیارە ئەی ویست جواب نەیاتەوە ،باوکم وتی ئەمە یەکت جواب نەیایەوە پرسیارێکی تر لای ئێوە عیسا چییە ؟ مامۆستا وتی خوای کاملە خوایەکی تەواوە

باوکم وتی لەلای ئێوە عیسا نەکوژرا لەخاچ نەدرا؟مامۆستا وتی بەڵێ ،باوکم وتی کەواتە ئێوە خواتان نەما ئێوە ئێستا بێخوان چونکە تۆوتت خوای کاملە عیسا

مامۆستا وتی ئەزانی ئەم مەسەلەیە هەتا قیامەت ئەمێنێتەوە بە نادیاری ،باوکم وتی واهەست ناکەی لە گومانا ئەژیت لای ئێوە نادیارە وەرە لەسەر ئیسلام هەرپرسیارێک ئەکەیت من جوابت ئەیەمەوە ،مامۆستا هیچ قسەی پێنەما هەرباوکم قسەی ئەکرد، ئەڕۆژە زۆر خۆش بوو لەژیانمدا وە بۆ شەوەکەی لەماڵەوە زۆر دڵخۆش بووم چوم سەعیم کردوو خەوتم.

بەیانی وەک ڕۆژانی ئاسای ڕۆشتمەوە بۆدەوام مامۆستاکەم بینی بەنوعێک سەیری ئەکردم نەم ئەزانی چییە ،گوێم پێنەیا دەوام تەواو بوو ڕۆشتمەوە بۆماڵەوە و شەو چومەوە بۆلای باوکم وتم ئەتوانم چەند پرسیاری ترت لێبکەم وتی فەرموو کوڕی خۆم .

**وتم هەمووومان بینیو مانە وەمن خۆشم بەژداریم کردووە کە عیبادەت ئەکەن چەپڵەو فیکەلێدەدەن و هەڵئەپەڕن و گۆرانی ئەڵێن ئایا ئەمانە تاوان بارن لەسەر ئەو ئیشە یان خێریان ئەگات ؟**

**وتی کوڕی خۆم موشریکەکانی سەردەمی پێغەمبەر** (عليه الصلاة والسلام) **نوێژەکەیان هیچ نەبوو لای بەیت بێجگە لەفیکەلێدان و چەپڵە لێدان ،وە ئەو کەسانەی ئەمڕۆ لەناو مزگەوتەکان ئەی کەنە دەف لێدانو شایو هەڵپەڕکێ و چەپڵەلێدان بەناوی زیکرەوە هەڵدەپەڕن بەناوی دین داری کەئەمە دینداری نییە گاڵتەو گەپە ،وە ئەو ڕەقسەی ئەمڕۆ صۆفیەکان ئەیکەن لەناو ئیسلامدا نییە وەکو چۆن نەشیدی ئیسلامی ئەمڕۆ تەپڵ و مۆسیقای لەگەڵە کەکەسانێکی حیزبی ئیسلامی حەلاڵی دەکەن بەلام بەس بۆئەوەی سەرنجی خەڵکی بۆلای خۆیان ڕابکێشن ،وە ئەمە لەدینی ئیسلامدا نییە وە بەکردنی تاوان بار ئەبێت .**

**وتم تێگەشتم لەمەش باشتێکی تربپرسم ،وتی فەرموو گوێم لێتە .**

**وتم گوێم لەمامۆستایەک بوو ئەیوت کیتاب ئەگۆڕن ئەمە یانی چی ؟؟**

**وتی کوڕی خۆم ئەمە جولەکەکان دوای ئەوەی بەڕاستی لە کتێبەکەی خۆیان تێگەشتن هەڵ ئەسان کتێبەکەیان ئەگۆڕی جا دوو جۆر گۆڕین هەیە یەکەم لەفزەکەی دووەم ماناکەی وە ئەمەش ئەمڕۆ هەڕەشەیە بۆ أهلی بیدع وە أهلی أحزاب ئەگەر هەر نصێک لەئایەت یان لەفەرمووده دژی ئەوان بێت واتاکەی ئەگۆڕن ،جائەگەر فەرموودە بێت ئەڵێن صحیح نییە وە ئەگەر ئایەت بیت ناتوانن بڵێن صحیح نییە ئەڵێن کێ ئەڵێ ئەو ئایەتە خاص نییە کێ ئەڵێت مەنسوخ نییە**

ئاوا شتەکەت لێ گەورە ئەکەن لێت ئەگۆڕن ،کەکوڕی خۆم ئەمە سیفاتی کەسی موسوڵمان نییە واللە سیفەتی جولەکەیە .

وتم تێگەشتم خواپاداشتت باتەوە با بچینە سەرپرسیارێکی تر،وتی گوێم لێتە کوڕم .

وتم کەسانێک هەن بە ئێوە دەڵێن کە هەقتان قبوڵ نییە ئیلا مەگەر لەجەماعەتی خۆتان بێت وە باوەڕتان بە هەقێک نییە کە لای کەسێک بێت کە خۆتان بەدڵتان نییە،ئایا بۆوان؟؟

وتی کوڕی ئەمە بوختانە بۆ ئێمەی أهلی سونە ئەکرێت چونکە ئێمە سێ ڕامان هەیە لەسەر ئەم مەسەلەیە یەکەم کەسێک هەیە هەموو قسەکانی درۆیە بەڵام ئەم قسەیەی ئەیکات ڕاستە، ئەم قسە ڕاستەی وەرئەگرین بەڵام هەموو قسەکانی تری بەدرۆ دا ئەنێین

دووەم یان عالمێک هەڵە یەکی کردووە ئایا بڵێین ئیتر تەواو گوێی لێناگرین نەخێر ئەو عالمە گوێی لێئەگرین ڕێزی هەر ئەمنێت بەڵام لەو هەڵەدا بەقسەی ناکەین

سێیەم کەسێکە شوێن عالمێک کەوتوە ئەڵێت من مەزهەبم فلآنە مەزهەبە من شوێن ئەو عالمە ئەکەوم ئەگەر هەڵەش بکات، ئەمەش بیروباوەڕێکی هەڵەیە و ئێمە  شوێن کەس ناکەوین لەهەڵەدا .

وه خوای گەورەش ئەفەرمویت کاتێک بانگەوازی ئەکران ئەیانوت ﴿قَالُواْ نُؤۡمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ﴿٩١﴾﴾ ﴿البقره﴾

واته:دەڵێت ئیمە باوەڕمان بەوە هێناوە کەبۆئیمە ڕەوانە کراوە.

وه ئەوەش کە دەڵێت ئێوە هەقتان قبوڵ نییە مەگەر کەسێک بەدڵتان بێت

ئەمە درۆیە بۆ ئیمە ئەکرێت چونکە ئیمە ئەگەر شەیتان کە دوژمن مانە هەقی لابێت هەقەکەی لێوەر ئەگرین وەک فەرموودەکەی أبی هوریرە کە ئەفەرمویت

( عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِي الله قَالَ : وَكَّلَنِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِحِفْظِ زَكَاةِ رَمَضَانَ ، فَأَتَانِي آتٍ فَجَعَلَ يَحْثُو مِنَ الطَّعَامِ ، فَأَخَذْتُهُ ، وَقُلْتُ : وَاللهِ لأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، قَالَ : إِنِّي مُحْتَاجٌ وَعَلَيَّ عِيَالٌ ، وَلِي حَاجَةٌ شَدِيدَةٌ ، قَالَ : فَخَلَّيْتُ عَنْهُ فَأَصْبَحْتُ ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (( يَا أَبَا هُرَيْرَةَ ! مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ الْبَارِحَةَ ؟ )) ، قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللهِ شَكَا حَاجَةً شَدِيدَةً وَعِيَالاً ، فَرَحِمْتُهُ ، فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ ، قَالَ : (( أَمَا إِنَّهُ قَدْ كَذَبَكَ ، وَسَيَعُودُ )) ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ سَيَعُودُ لِقَوْلِ رَسُولِ اللهِ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : إِنَّهُ سَيَعُودُ ، فَرَصَدْتُهُ ، فَجَاءَ يَحْثُو مِنَ الطَّعَامِ ، فَأَخَذْتُهُ ، فَقُلْتُ : لأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللهِ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، قَالَ : دَعْنِي فَإِنِّي مُحْتَاجٌ وَعَلَيَّ عِيَالٌ ، لا أَعُودُ ! ، فَرَحِمْتُهُ ، فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ ، فَأَصْبَحْتُ ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (( يَا أَبَا هُرَيْرَةَ ! مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ ؟ )) ، قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللهِ شَكَا حَاجَةً شَدِيدَةً وَعِيَالاً ، فَرَحِمْتُهُ ، فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ قَالَ : (( أَمَا إِنَّهُ قَدْ كَذَبَكَ وَسَيَعُودُ )) ، فَرَصَدْتُهُ الثَّالِثَةَ ، فَجَاءَ يَحْثُو مِنَ الطَّعَامِ ، فَأَخَذْتُهُ ، فَقُلْتُ : لأَرْفَعَنَّكَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ، وَهَذَا آخِرُ ثَلاثِ مَرَّاتٍ : أَنَّكَ تَزْعُمُ لا تَعُودُ ثُمَّ تَعُودُ ، قَالَ : دَعْنِي أُعَلِّمْكَ كَلِمَاتٍ يَنْفَعُكَ اللهُ بِهَا ، قُلْتُ

: مَا هُوَ ؟ ، قَالَ : إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ (( اللهُ لا إِلَهَ إِلا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ )) حَتَّى تَخْتِمَ الآيَةَ ، فَإِنَّكَ لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنَ اللهِ حَافِظٌ ، وَلا يَقْرَبَنَّكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ ، فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ ، فَأَصْبَحْتُ ، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللهِ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (( مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ الْبَارِحَةَ ؟ )) ، قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللهِ ! زَعَمَ أَنَّهُ يُعَلِّمُنِي كَلِمَاتٍ يَنْفَعُنِي اللهُ بِهَا ، فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ ، قَالَ : مَا هِيَ ؟ , قُلْتُ : قَالَ لِي : إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ آيَةَ الْكُرْسِيِّ مِنْ أَوَّلِهَا حَتَّى تَخْتِمَ الآيَةَ (( اللهُ لا إِلَهَ إِلا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ )) ، وَقَالَ لِي : لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنَ اللهِ حَافِظٌ ، وَلا يَقْرَبَكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ ، وَكَانُوا أَحْرَصَ شَيْءٍ عَلَى الْخَيْرِ ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : (( أَمَا إِنَّهُ قَدْ صَدَقَكَ وَهُوَ كَذُوبٌ ، تَعْلَمُ مَنْ تُخَاطِبُ مُنْذُ ثَلاثِ لَيَالٍ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ ؟ )) ، قَالَ : لا ، قَالَ : (( ذَاكَ شَيْطَانٌ )) . رواه البخارى. )

**بەسەرهاتەکەی أبی هوریره لەگەڵ شەیتان کەپێغەمەبەر**(صلی الله علیه وسلم ) **فەرمانی بە أبی هوریرەکرد لەپاراستنی سەرفترەی ڕەمەزان ،جا زەلامێک هات دەستی کرد بەبردنی خواردن لە کۆمەڵەی سەرفترە بە گۆیل دەیماڵیە ناوکۆشی منیش گرتم :وتم بەخودا دەتبەم بۆ خزمەتی پێغەمبەر** (صلی الله علیه وسلم) **تاتۆڵەی ئەوتاوانەت لێبسێنێت کەئەیدزیت ،بەڵام کابراپاڕایەوە وتی ئەمە بۆنەدارانە منیش نەدارم وە من خێزانێکی زۆر ڕەش و ڕوتم کەوتوە بەسەردا بۆیە منیش ئازادم کرد ،بۆبەیانی پێغەمبەر**(صلی الله علیه وسلم)**فەرمووی ئەوەچییت لەدیلەکەی دوێنێ شەوکرد وتم سکاڵای لەدەست نەبوونی و بەسەرا کەوتنی خێزانی زۆرکرد منیش بەزەیم پێدا هاتەوە ئازادم کرد، فەرمووی درۆی لەگەڵ کردی ،دیسان بۆشەوی دووەم خۆم لێداگرت تاهاتەوە دەستی کرد بەمشت لێدان لەخۆراکەکە منیش گرتمەوە وتم دەتبەم بۆدادگا بۆلای پێغەمبەر وتی**

ئەم جارەش مەمبە ئەمە بۆ هەژارانە منیش هەژارم ئیتر بەخوا نایەمەوە منیش بەزەیم پێیدا هاتەوە ئازادم کرد بۆ سبەینێ فەرمووی چیت لەدیلەکەکرد ؟وتم دیسان سکاڵای لەدەست نەبوونی بوو منیش بەزەیم پێدا هاتەوە ئازادم کرد فەرمووی دیسان درۆی لەگەڵ کردویت دێتەوە

جاشەوی سێیەم هاتەوە دەستی کرد بەبردن لەڕزقەکە،منیش پڕم پێدا کردوو گرتم وتم ئەم جارە ئەتبەم بۆ دادگای کردن بۆلای پێەمبەر ،تۆئەمە سێ جارەئەم درۆیە ئەکەیت ئەڵێی نایەمەوە کەچی هەریەیتەوە کەچی وتی ئەگەر وازم لێ بێنیت چەند وشەیەکی سوکەڵەو کەمت فێرئەکەم ،کەخوا بەهۆی ئەوە سودو قازانجت پێ دەگەیەنێت ،وتم کوا؟ کامانەیە؟وتی کەئەچیتە سەرجێگەی خەوتن (آية الكرسي) بخوێنە خوای گەورە ئەتپارێزێت لەشەیتان تا بەیانی .

جاسبەینێ پێغەمبەر فەرمووی ئەرێ دیلەکەت چی لێکرد؟ وتم عەرزی چەن وشەیەکی کردم کە گوایە سودم پێدەگەیەنێت منیش بەرەڵام کرد ،فەرمووی ئەو وشانە کامانەن؟ وتم پێی وتم (آية الكرسي) بخوێنە کەدەچیتە سەرجێگای نوستن ئەوە لەشیتان پارێزراو ئەبیت تابەیانی،فەرمووی ڕاست ئەکات ئەو درۆزنە ،فەرمووی ئەزانی ئەو کەسە کێ بوو کە ئەوسێ شەوە هات؟وتم نەخێر ، فەرمووی ئەوە شەیتانە .

ئەوەتا ئێمە شەوانە پێش ئەوەی بخەوین ئەڵێین ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَیُّ ٱلۡقَیُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةࣱ وَلَا نَوۡمࣱۚ لَّهُۥ مَا فِی ٱلسَّمَـٰوَ ٰتِ وَمَا فِی ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِی یَشۡفَعُ عِندَهُۥۤ إِلَّا

بِإِذْنِهِۦۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ
وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ )

**خۆئەمە لەلایەن کەسێکەوە بۆمان هات ڕقمان لێیەتی و دوژمن مانە بەڵام چونکە هەقە وەری ئەگرین .**

**وە خوای گەورە ئەفەرموێت**﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَيْءٍ ﴿١١٣﴾﴾**﴿البقره﴾**

**واتە:جولەکەکان دەلێن گاورەکان لەسەر هیچ بنەماو ڕاستی نین ، گاورەکان دەلێن جولەکەکان لەسەر هیچ بنەماو ڕاستی نین .**

**ئێمە هەق وەر ئەگرین ئیتر گرنگ نییە هەرکەسێک بێت چونکە ئێمە جولەکە و گاور نین.**

**وتم تێگەشتم خواپاداشتت باتەوە باشتێکی تر بپرسم ،وتی گوێم لێتە کوڕم**

**وتم ئێوە ئەڵێن کەسانێک هەن دژایەتی دینەکەی خۆیان ئەکەن ،وە دژایەتی دۆستانی دینەکەی خۆیان ئەکەن ئەمە چۆن؟**

**وتی کوڕی خۆم کەسانێک هەیە خۆی بە موسوڵمان ئەزانێت بەڵام دژایەتی موسوڵمانان ئەکەن وەکو عەلمانیەکان کە بەخۆیان ئەڵێن موسوڵمان وە دژایەتی دینی ئیسلام ئەکەن وە دینی کافرەکانیان خۆش ئەوێت ئەیانەوێت وەکو ئەوان بن ،وە ئەوانەی دینداری ئەکەن دژایەتی هەقیقەتی دینی ئیسلام ئەکەن**

کەبرتییە لە (توحید) ئەگەر پێی بڵێیت بەس خوای گەورە بپەرستە بەس داوا لەو بکە ئەوە ڕقی لیێت ئەبیێت بووختانت بۆ ئەکات ،بەخۆشی ئەڵێت موسوڵمان دژایەتی (توحید) ئەکات ،وە بەداخەوە ئەمرۆ گەنجەکان موعجیبی دینی کافرە کان کە ئەوان بەئاشکرا دژایەتی دینی ئیسلام ئەکەن کەچی ئەمان خۆشیان ئەوێن،ئائەمانە ئەو کەسانەن کە دژایەتی دینەکەی خۆیان ئەکەن وە دژایەتی دۆستانی دینەکەی خۆیان ئەکەن .

وتم تێگەشتم لەم پرسیارەش با ئەم پرسیارەش بکەم ،وتی فەرموو کوڕم

وتم کەسانێک هەن ئینکاری قەزاوقەدەر ئەکەن ئەڵێن بونی نییە،وە کەسانێکیش هەن کەتوشی شتێک یان تاوانێک ئەبن ئەڵێن لە قەزاو قەدەرە لەقەدەرمان نوسراوە ،وە کەسانێک ئەڵێن قەزاو قەدەرە کە ئێمە لەسەر ئەم ڕێچکەیەین ؟

وتی کوڕم ئەم پرسیارە سێ بەشە باجوابت بەمەوە ئەوانەی کە ئەڵێن قەزاو قەدەر بوونی نییە ئەمە کوفرە چونکە پێچەوانەی یەکێکە لەشەش ڕوکنەکە. وە ئەوانەی ئەڵێن کە تاوان ئەکەن قەزاو قەدەرەیان نوسراوە باشە ئەمە لەکوێ زانی ئەبێت ئەو تاوانە بکات بۆ لەبری ئەو خراپەیە وابیر ناکاتەوە ئەبێت کاری چاکە بکات خێری بگات ،وە ئەوەی کە ئەڵێت ئەمە قەزاوقەدەرە لەسەر ئەم ڕێچکەیەین ئەمە شتێکی کۆنە هی سەردەمی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم) کە موشریکەکان ئەیانوت ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بوایە شیرکمان

**نەئەبوو وە نە باوک و باپیرانمان شیرکیان ئەبوو ،گلەی لە خوا ئەکەن ئەمەش قسەی موشریکەکانە کوڕی خۆم .**

**وتم :تێگەشتم خوا پاداشتت باتەوە ،وتی پرسیاری دواتر ،پێکەنیم وتم باشە**

**وتم کەسانێک بە ئێوەی ڕیشدار ئەڵێن خراپە بڵاو ئەکەنەوە وە دینی خەڵکیش ئەگۆڕن ،وە ئەتانەوێت بچنە سەر دەسەڵات کە ئاشکراش واناڵێن .**

**وتی کوڕی خۆم ئەوانەی پێمان ئەڵێن ئێوە خراپە بڵاو ئەکەنەوە کاتێک فیرعەون ویستی موسا**(علیه الصلاة والسلام) **بکوژێت بەبیانوی ئەوەی کەموسا**(علیه الصلاة والسلام) **دینەکەیان ئەگۆڕێت وە ئەگەر نەشی کوژێت ئەوە خراپە بڵاوئەکاتەوە لەزەویدا وە خوای گەورە باسی ئەمەی کردووە ئەفەرموێت** ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ ٢٦﴾﴿**غافر**﴾

**واتە:بەڕاستی دەترسم کە دین و ئاینتان بگۆڕێت وە دوو بەرەکی و شەڕو شۆڕ و خراپە لە سەرزەوی بەرپابکات .**

**وە ئەگەر بەڵگەیان پێنەما بەرامبەرمان ڕەدی هەموو شوبهەکانیانمان دایەوە ئەو کاتە دەست ئەکات بەشکات لای حاکمەکان وە لای ئەوان ڕاستی ناڵێن بوختان ئەکەن وە کو ئەوانەی چوونە لای فیرعەون وتیان ئایا ئاوا واز موسا**(علیه الصلاة والسلام)**و قەومەکەی دەیەنیت خراپەو تاوان بچێنن وە واز لەخۆت و خواکانت بهێنن !؟**

**خوای گەورە باسی ئەمەی کردووە و ئەفەرمویێت**﴿وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ ﴿١٢٧﴾ ﴾**﴿الإعراف﴾**

**وە ئەمانەویێت بچینە سەردەسەلاٚت ئەمە بوختانە چونکە ئەگەر مەبەستمان دەسەلاٚت بوایە ئیٚمەش ئەچووین حیزبیٚکمان دائەنا بۆ گەیشتن بە دەسەلاٚت بەلاٚم ئیٚمە خەلٚکی بانگ ئەکەین بۆدینی خوا بۆناسینی توحید وە شیرک وە دینیٚکی وەسەتیەت نەشل ڕەو نەتوند ڕەو ، ئەو کەسەی ئەو قسەیەش ئەکات پیێ ئەلیٚین**

قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (البقرة:111) **بەلٚگەکانتان بهیٚنن ئەگەر لەڕاستگۆیانن .**

**وتم تیٚگەشتم خواپاداشتت باتەوە ،باپرسیاریٚکی تربکەم ،وتی فەرموو**

**وتم کەسیٚک بەناوی دینی خواوە قسەئەکات وە عیلمیٚکی کەمی بەدینەکەی خوا هەیە ئایا تاوان بار ئەبیٚت ؟؟**

**وتی کوڕی خۆم ئەوانەی بەناوی خواوە قسەئەکەن فلاٚن شت حەلاٚلە وە فلاٚنە شت حەرامە ئەوە خوای گەورە پیٚیان ئەفەرمویٚت** ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ﴿١١٦﴾ ﴾**﴿النحل﴾**

**واتە :نەکەن هەر بەدەم بڵێن ئەمە حەڵاڵە و ئەوە حەرامە بۆ ئەوەی درۆ بەناوی خواو ئاینی خواوە هەڵبەستن ،بەڕاستی ئەوانەی درۆ بەناوی خواو ئاینی خواوە هەڵدەبەستن سەرفرازو سەرکەوتوو نابن.**

**وە قسەکردن بەناوی خواوە بەبێ عیلم تاوانێکی زۆر گەورەیە لەشیرک گەورەترە وە خوای گەورە ئەفەرموویێت**﴿قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْيَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾**﴿الإعراف﴾**.

**جاسەیربکە کوڕی خۆم واتای ئایەتەکە ئەی نێرد راوی خوا پێیان بفەرموو پەروەردگارم ئەم شتانەی حەرام کردوە** ( سەیـری ئەم سەرکەوتنانە بکەن لەبچوکە بۆ گەورە لەخەتەرەوە بۆ خەتەر تر )

**یەکەم: هەمووکارێکی خراپە و بەد ڕەوشتی .**

**دووەم: تاوان و گوناح سەرپێچی فەرمانی خوا.**

**سێیەم : دەست درێژی کردن و ستەمکردن لەخەڵک کە هەق نییە، ئەوەشیان کەخوای گەورە حەرامی کردووە تۆ زوڵم لەخەڵک بکەیت حەرامی کردووە لەسەرت خوێنی خەڵک، ناموسی خەڵک،ماڵی خەڵک.**

**چوارەم: شەریک بۆخوا دابنێن کە هیچ دەسەلاتێکیان پێنەدراوە**

**پێنجەم : بەناوی خواوە شتێک بڵێن بەبێ زانست و عیلم .**

وتم زۆرباش تێگەشتم کەهیچ تاوانێک نییە لەقسەکردن بەناوی خواوە بەبێ عیلم گەورەتر بەم پرسیارە کۆتای بەپرسیارەکانی ئەم شەو ئەیەنم، وتی فەرموو

وتم کەسانێک هەن هەق ئەشارنەوە وەهەق ئەشێوێنن وە ئەگەر هەقیش بڵاو بێتەوە ناهەقی تێکەڵ ئەکەن ،تۆرات چییە لەسەر ئەم جۆرەکەسانە ؟

وتی کوڕم ئەوەی کەهەق ئەشارێتەوە ئەوە سیفەتی گاورو جولەکەکانە چونکە لەتەورات و ئینجیلدا باسی هاتنی محمد(صلى الله عليه وسلم) کراوە ،ئەوانەی کە کتێبی خوایان بۆ چووبوو چۆن کوڕی خۆیان ئەناسی ئاوا محمد (صلى الله عليه وسلم) ئەناسی کە پێغەمبەری خوایە بەڵام ئەیان شاردەوە ،وە ئەوانەی کە هەق ئەشێوێنن ئەمەش سیفاتی جاهیلیە بەس بۆئەوەی خەڵکی هەق نەبینێت وە خەڵکیش ئەخەڵەتێت .

وتم تێگەشتم خوای گەورە پاداشتت باتەوە باقسەکانمان تائیرە بێت ئەوەی مایەوە بۆ کاتێکی تر چونکە کات درەنگە ،وتی باشە ، چومە ژورەکنەی خۆم سەیری واجبەکانم کردوو خەوتم .

************************

وە لەدوای وەرگرتنی ئەو وەڵامانە گۆرام بۆ کەسێکی تر وە زانیم کام ڕێبازە هەقە ئەو ڕێبازە هەقە کە شوێن قورئان و فەرموودە ئەکەوێت ،بۆیە بڕیارمدا داوای لێبکەم ببم بە خوێندکار لای ئەو بۆیە پێم وت ئەمەوێت ببم بەخوێنکاری تۆ وتی باشە کوڕم بەڵام ئەم چەند نەسیحەتەم لێوەرگرە کەدین ئەخوێنیت بابۆئەوە نەبێت موناقەشەی پێبکەیت لەگەڵ خەڵکیدا وە بۆئەوە نەبێت لە

دانیشتنەکانا خۆت هەڵکێشیت و قسەی زل بکەیت بەڵکو بابۆ ئەوەت بێت ببی بەخزمەتکاری دین و خەڵکی بانگ بکەی بۆلای دینی خوا وە خوای گەورە بیکات بەڕوناکی ڕۆژی قیامەتت، وتم (إن شاء الله) پشت بەخوا ،وتی کوڕی خۆم من بەم شێوازە دەرزت پێدەڵێم ئەگەر ڕازینیت ئەوە مامۆستایەکی تر بۆخۆت هەڵبژێرە من یەکەم وانەکان لە عەقیدەوە دەست پێئەکەم کتێبەکانی عەقیدە وە دووەم مەنهەجی پێغەمبەران( علیهم الصلاة والسلام) ، صەحابە،تابعین،تابعی تابعین ..هتد باسی ئەو مەنهەجانە ئەکەم لەسەر کتێبی زانایان،سێیەم عیلمی فەرموودە شەرحی کتێبەکانی فەرموودە ئەکەم ،چوارەم خوێندی کیتابی فقهی (أصول فقه) پێنجەم کتێبەکانی زمانی عەرەبی، نەحو صرف ،وە لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز ،وتی ڕازیت؟ وتم بەڵێ ئیتر لەو ڕۆژەوە من خوێنکارێکم لە خوێندنی زانستی شەرعی لای مامۆستایەک کە بەڕاستی زیرەکە ،داواکارم لەخوای گەورە ئەو مامۆستایە بپارێزێت وە بۆ منی بهێڵێت .

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله

کۆتـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــاى

لەکۆتایدا ئەلێم :

خوای گەورە ئەفەرمویێت ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا ٥﴾ ﴿الشرح﴾

واتە:لەدوای ناخۆشی خۆشی دێت

ئەوکاتەی کەباوکم کۆچی دوای کرد ژیانم زۆر نارەحەت بوو زۆر ناخۆش بوو بەلاّم ئەوە پەیمانی خوایە کە لەدوای ناخۆشی خۆشی دێت بۆیە خوای گەورە ئەوکەسەی بۆناردم بەڕاستی ژیانمی گۆڕی لەشیرکەوە بۆ توحید وە فێری دینی ئیسلامی کردم وەکوخۆی بەبێ زیادو کەم وای لێکردم نە توند ڕەوبم نەشل ڕەو

وە دینی وەسەتیەت وەرگرم ،وە دواکارم لەخوای گەورە هەموو کەسێک مامۆستایەکی وەک ئەوەی منی بۆ بنێرێت و هیدایەتی بات بۆ سەر ڕێگای ڕاست

وە سوپاسی خوائەکەم کە منی لەشیرکەوە هینایە لەسەر ڕێگای تەوحید

وە داواکارم لەخودا بەردەوامم بکات لەسەر ئەم دینە هەقە وە عیلمم پێببەخشێت وەبمکات بەخزمەتکاری دینەکەی وە لەپێناوی ئەودا بژین وە لەپێناوی ئەودا بمرین.

